ژوەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد - دهۆک 248

ماجد ئەلحەیدەر

# مالانێ

کورتە چیرۆک



ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد/دهۆک

ژمارە (248)

# مالانێ

کورتەچیرۆك

ماجد ئەلحەیدەر

2012

www.duhokwriters.com

* ناڤێ پەرتوکێ: **مالانێ**

* نڤیسەر: **ماجد ئەلحەیدەر**

* دیزاین: **مسعود محمد**

* **تابلو:** Oso, ARTWORKS

* **چاپا ئێکێ: 2012**

* **وەشانا هژمار: 247**

* چاپخانا: **هاوار – دهۆك**

* تیراژ: **(500) دانە**

* هـژمارا سـپاردنێ: 2185 – یـا سـالا 2012 ل پـەرتوکخانا بەدرخانیا - دهوك

# ناڤەروك

ڤەلەرشك................................. 5

مالانێ....................................... 15

چیرۆکا مرۆڤەکی کو لحێفا وی درێژتر بوو ژ پێن وی!................................... 29

CH3CH2OH.............................. 41

سترانەك...................................... 47

رێڤینگ....................................... 51

خوداوەندێ دەستچەپ ! ........................... 57

شەش کورتە چیرۆك بۆ دویماهیکێن وەغەرێ..................................... 61

## ل بیرهاتنا "ئەدگار ئەلەن پۆ"

ڤێجا ئـەو خەونـەك بـوو ؟ بێژنـە مـن ئـەی كەڤنـە ردبەنێن پەرست"دهێن پیرۆز ئـەوێن دزانـن ڤـەكرنا هەمی خەونێن سەیر .. ئەو خەونەك بوو؟
من نەزانی كا چەوا هاتە ناڤ ژورا من .. پیرەمێرەك یـێ بـەژن درێـژ و بهێـز بـوو.. وهنـدەك ناڤمـل چەمیایی بوو..
هنـدەك مـویێن سپی ژبـن كـولاڤێ وی یـێ گرۆڤـرٍ ونەقشاندی ب چەند نڤیسینەكێن نـەدیار ؛ كۆ مـن نەدشـیا بـاش بخـوینم، دەركـەتبوون. چـاڤێن وی دبرسقین ب تیشكەكا تیژ بـێ وێنـە، و ژ تبلێن وی یێن زراڤ و درێژ جوٚكێن بچویك ژناڤ و روناهیێ لـێ دچوون ، بەلێ نە دگەهشتنە ئەردی.
ب شادی وب لەز پێش ڤـە چووم و مـن گـوتێ : ئـەز تــە دنیاسـم ، تـوی ئـەو !.. تـوی ئـەو ! .. تـوی هۆزانڤان!

بەلیٚ هیٚدی ب نك من ڤە هات و دەستیٚ خوٚ ل سەر دەڤیٚ من دانا..
چ نە گوٚت، لیٚ من زانی وی نەڤیٚت ئەز نافیٚ وی بیٚژم ، بەلکی دا چ مەترسی کوٚ من نەدزانی و وی دزانی نەکەڤیتە سەر من.
پشتیٚ ئەز کیٚمەك تەنا بوویم دەستیٚ خوٚ ب ئەنیا من ڤە نا . هەر دگافیٚ دا من هەست کر کو گیانیٚ من یێ ڤالا دبیت ژگرانیا وەستیان وگەمارێن چەرخێن سەد سالێن گەلەك درێژ ، و هێدی هێدی سترانەکا شین بوٚ گورمەگورم دناڤ سەریٚ من دا ودەنگ ڤەدا ( کو وی سروشا ویٚ دا من ) دەنگ ڤە دا .. سترانەکا سەیر و پری نهێنی و خوزی بوو.
هێدی ئەنیخسەك ل ئەنیشکا من دا ، من خوٚ دیت ژ دەر ڤەمە .. بتنیٚ برێڤە دچم ل رێکا کولیژا مە یا کەڤن ، بەری بلندبوونا تەلارێن ئیمبراتوٚرێن ڤی دەمیٚ تەحل: ئەو ئوتێلا کەڤنار ئەوا هەڤالیٚ من یێ ژگوندیٚ باشووری دهات لیٚ ڤە دحەویا هەر یا

ڤەدهەژیت ل چەپا جادێ، وئەو نانپێژ ل بەرامبەر ژی دەست ب باوەشکێن خەوا شرین کرن.

ئەز گەلەك بچویك تر بووم ژنوکە؛ دبیت بیست سالی بووم .. ئەڤە ئەلندێ سپێدەکا هاڤینێ ب شەرمی روناهیا خۆ ل سەربانێن خانیان بەلاڤکر. شەڤ گەریەکا پۆلیسان یێن ب چاڤ خەو ب بێ تاقەتی ل سەر جادێ برێڤە دچوو، وهندەك چویچکێن ب جورعەت خۆ دهەلاڤێتن لسەر ڤێرێ تێر بشەها شەڤێ و تەنبەلی ژ لەشێ خۆ یێ بچویك دا دا دقوتا .. ئەرێ ب راستی ئەزێ بتنێ بووم ؟

ئەرێ ب خودێ من هاژێ هەبوو کو ب هزاران کەسێن دی یێن ئەز نەشێم ببینم ب رێڤە دچوون وەك رەشەیێن ب حێبەت دناڤ بەرا گورەپان و کاڤلێن شارێ من .. ئەو هەمی هۆزانڤان و فەیلەسوفێن برسی بوون .. هندەك ژوان ب ریهێن چڕ وەك هوریا تەحتی وسەروچاڤێن بێ رەنگ و تەمری ول پشت بەرچاڤکێن ستوور و ب رەنگی خولی یێ خۆڤشارتی .. ئەو هەمی ب کراسێن کەڤن

و یاخە چوی و دێمێن دەمەکێ درێژ بێهنا سابوونێ ژبیرکری .. ئەو هەمی .. ئـــاخ!!

هندەك ژڤان هێشتا یێ شکەستنا خۆ د ئالیسن .. هندەك ژی هێشتا ئاخا گورستانێ یا ب دێمێ وان ڤە، و هندەك ژڤان ئەها نهو یێن ژ سەردابێن تاری دەرکەتین، و هندەك ژڤان هەتا هەتایێ هەڤال و خەلکێ وان یێن هاڤێتینە پشت خۆ و.. ئێکجار کێم ژڤان هێشتا بدەنگەکێ لاواز و پر ترس ستران دگۆتن.

ئەڤە هەمی بەدبەخت و دوورکری بوون . ڤان هەمیان پارە نەبوون دا پێنووسێن ئەوێن وەسیەت یان مێژوییێن سەرشووریا خۆ پێ بنڤیسن !

"ئەی سترانا شین .. پیچەك چاڤەرێ بە !"

ئەی سترانا شین ژ من نە رەڤە !

چاڤەرێ بە ئەی ستران .. تا پێنووس و هندەك کاغەزا بینم !"

ل سەرێ جادێ دوکانەکا هەی هەتا سپێدێ ڤەدکەت .. بلا ڤێ دەلیڤێ ژ دەست نەدەم پێشی پۆلیسێن

شەڤگەریّ ل نك ئەو ژنكا ماست فروش (ئەوا نووكە هاتی و ل كوژیكیّ خوّ یێ هەرجار روینشتیە خواریّ) كوم بین. ئەز ب نك ڤە چووم و من دیت دوكان یا روهنە. من سوپاسیا خودیّ كر دەمیّ من دەستەكیّ پێنووسا لسەر ستێركیّ دیت. من ئێك كڕی .. نە، نا ئاخڤم نەكە دەنگیّ من ئاشكەرا بكەت.

ئەز پاشڤە بوّ كافلیّ خوّ زڤریم . من گوتە خوّ " ئەگەر من كاغەزەك داخاز كر ل ڤی دەمی دیّ بیتە جهیّ گومانیّ . بتنیّ سەر و بەریّ من یێ دڕندە و كویڤی بەسە دا ترس و گومانێن ژ دلیّ ڤی موختاریّ خودانیّ دوكانیّ ل من رابن !

ئەگەر من پاكیتەكا دی دیتەڤە دیّ تێرا من كەت"

ژ نشكەكیّ ڤە وەك لەعنەتەكیّ ژ جادوگەرەكا پیر و پرچ بوّز هاتە هاڤێتن ، وەك نەساخیەكا نشكاڤەیی، من هەست ب تێهنیەكا دڕندە كر .. نە ، تێهنی نە بوو ، بەلكی ئارەزویەكا بێ وێنە بوّ ڤەخوارنەكا تەزی (بوّ ڤەخوارنەكا سودایی ب شێوەیەكی

تایبەت!)... ئەی خودێ ! ئەرێ هەمی فەرهەنگێن سەر زەمین دزانن کا چ دبێژنە ڤێ خوزیا نە سروشتی ؟ و د دوماهیکا شەڤێ دا؟!

بەلێ .. بەلێ ئەی دیناتی ! پاشمایەکێ دراڤا یێ د بنێ بەریکێ دا مای. من بوتلەکێ تەزی هەلگرت و ڤالا کرە سەر هناڤێن خۆ . من هاژ یێ هە بوو کە خوشی یەك یا د لەشێ من دا دچێتە خوارێ ودگەهشتە تبلێن من . من گوتە خۆ ب راستی ئەڤە مەیا (ئیلاهی ) یە !"

چەوا ڤی کاری ب هویری رویدا ؟ ئێك تشتێ بتنێ بیرا من لێ دهێت : دەمێ من ئەو بوتل ڤالا کری من دڤیا ب زڤرین مە ڤە، ئەوێ بێ ناموسی نە دڤیا ژ دەڤێ من دوور بیت ! هندەك سێرێن رەش ئەو ب لێڤێن من ڤە چەسپاند کو چەندی من هەولێ دا دوور بیت ! ئەو ب هێزتر دچەسپاند.

"دوور کەڤە !" من گازی کر "دوور کەڤە ئەی مارێ شەیتان ! ئەو بتنێ خوزیەکا ئێکی دین بوو ودەرباز بوویە د دوماهیا شەڤێ دا .. دویر کەڤە !"

نەخێر بوتل مەزن تر و هەر مەزنتر لێ هات .. ئەڤە ئەوە نووكە لسەر سینگێ من نهشت وئەز بەرتەنگ كریم. بەری ئەز ب خەندقم و هندی هێزا من مای من هەولێ دا .. ئینا ڤەرەسیا و ب ئەردی كەت وهوور هوور بوو.

هەر وەكی لناڤ چیروكێن كەڤن من ب چاڤێن خۆ دیت كو پرتێن شویشێ یێن بەلاڤ جارەكا دی یێن كووم دبن ودبنە قەلەرشكەكا پەرِ رەش وەكی رەزیێ ودو پەرێن بەر فرەهـ.

ترسەكا مەزن كەفتە دگیانێ من دا. لەو ما من غاردا و ئەز رەڤیم بێی كۆ بزانم بۆ كیڤە . لێ قەلەرەشك ما لدویڤ من و ب باوەریەكا موكم و پشت راست قرِقرِ دكر و د فری ب بلنداهیا سێ چار بهوستان ل هنداڤ سەرێ من.

من هزر دكر قرِقرِا وێ هندەك ژ دەنگێ مرۆڤان تێدایە . پشتی هینگێ وەستاندنێ وبێ هیڤیێ ئەز گرتم، لەو ما گیرو بووم، لێ ئەو ژی گیرو بوو . ئەز راوەستیام بەلێ قەلەرەشك ما ل هنداڤ سەرێ من.. و

دەنگێ وێ پتر رون بوو : _" قاق .. قاق .. بەرێز ..
تو بەهرا منی!
قاق .. بەرێز .. قاق .. تو بەهرا منی !"

...

سیه سال بۆرین .
من قەلەمێ خۆ شکاند و هاڤێته د رویباری دا.
و ژنا خۆ بەردا .
وسیه جاران شوول وکارێ خۆ گوهۆری.
دەست ژکەس و کارێن خۆ ڤە .... بووم و ژشارێ خۆ بارکر.
هەزاروئێك جار دێمێ خۆ گوهۆری .
لێ قەلەرەشکا من چ جارەکی خۆ ژ من جودا نەکر..
دگەل من گوهێ خۆ ب دەنێ .. ئە رێ هەوە گوه لێ دبیت:
"بەرێز .. بەرێز .. تو بەهرا منی ! !"

## ل بیرهاتنا خالێ رەزا .. ئەو مرۆڤێ فریشتە

- دنك... دنك.. دووگ

_ كییە؟

_ ئەزم!

- چق... چق.. سەرچاڤان هاتی ، كەردم كەن!

بڤی رەنگێ یاریێ دەستپێدكر. جار دویڤ جارێ ئەو كورێ كولاڤێ باپیرێ خۆ یێ كەڤن ددانا سەر سەرێ خۆ و ساكۆیێ وی -یێ ب رەنگێ كلێ چاڤان، یێ تێكەل ب هندەك خالێن سۆر وەكی دندكێن هناران- لبەر خۆ دكر هەتا كو بەژنا وی یا بچویك تێدا بەرزە دبو و دگەهشتە پێن وی، وتویركەكێ كاغەزێ یێ ئەسمەر كو پرتەقالەك یان سێڤەك دگەل سەوكەكا نانی تێدا هەلدگرت ورادوەستیا لبەر دەرگەهەكێ ناشوپی و دەنگێ قوتانا دەرگەهی نمایش دكر، دا وێ كچكا روینشتی لبەر تاخمێ چای ڤەخوارنێ ب قەستا، ولەشێ خۆ ژی ب رەش

عـەبایێ دایکا خـۆ پێچای، دا بیـژیت: ئـەو کییـە؟ و دەرگـەهێ ئاشـوپی ڤـەکری دگـەل دەنگـێ ڤـەکرنا کلیلێ.. چییر.. دا کو ئەو مێهڤان بهێتە ژور..

ویاریێ بڤی رەنکی دەستپێدکر.. ئـەو یاریـا کۆ ژ دوباره کرنـا وێ ڤـەت بێـزار نـە دبـوون، هەرچـەندە رۆلێ زارڤەکرنێ دناڤ یاریێ دا ل ئێك ودو دگوهارتن، یانــژی زێــدە بوونــا هنــدەك زارۆکــێن مێهڤــان و دراوســێ.. کــو هنــدەك جــاران دبوونــە مێهڤــانێن ڤەدربلندێن یاریێ..

پیرەمێر، یێ ل سەر تەختێ خو بێ سفری ئـەوێ دبرسڤی دژورا وی ڤـە، ئـەوێ هـەتاڤ دهاتـە نیڤـا وی دپەنجـەرا ڤـەکری را، نـەیێ نـەخوش بـوو، ل دویڤ گوتنا نوشداری:

**- چ نینـە بتنـێ پیراتییـە.. بهـێلن دا بێهنـا خـۆ ڤەدەت.. ب بێ دەنگی و ئارامی وەغەرکەت...**

گـوهێ خـۆ ددا دەنگـێ زارۆکـان ئـەوێ ژلایـێ دی دهات.. بەلێ نەڤیا وی ئەوا چا تێـدکر بـۆ وان خزمـا ئەوێن نوکـە ژ ژورا پیرەمێـری دەرکـەتین دا بروینـە

خوارێ ل دەوروورەخێن دارکنێرا مەزن (ئەوا سیبەرا وێ حەوشا بەردای هەمی ب خوفەدگرت) هند زوری ل زاروکێن خۆ نەدکر کو دەنگێ خۆبلند نەکەن.. دزانی کو باپیر ژ دەنگێ زارۆکان تورە نابیت هەرچەند دەنگێ وان یێ بلند بیت ژی. و دزانی گوهێن باپیری یێن گرانن و باش گوه لێ نابیت.. بەلێ یا ب تایبەت ل ڤێ سپێدێ، ب رەنگەکی ئاشکرا و سەیر گوه ل هەمی دەنگان دبوو: چیو چیوا چویچکان و دەنگێ پانکا کەڤنار یا لسەر مێزێ لدۆر سەرێ خۆ چەپ و راست دزڤری، هەر وەك دایکەکا دلوڤان یا چاڤدێریێ ل هەمی کەسێن دزورێ ڤە دکەت، و پرپبێژیا مێهڤانان ئەوێن دزڤرینە گوتنێن خۆ یێن هەر جار.. و دەنگێ یاریێن زارۆکان ل بن پەنجەرێ..

نە..ئەو ب دەنگێ زارۆکان بێزار نەدبوو ..

**-"ئەرێ ما مرۆڤ ب دەنگێ فریشتان بێزار دبیت ؟!"**

هەر جارەكا بچويك بێ دەنگ كر بانە پيرەمێرى ئەڤ ئاخفتنە دوبارە دكر. و ئەڤ هەر دو بچويكێن جوان و ئارام دويماهيك خەلەك بوون ژوان زاروكێن پشت بۆ پشتێ لسەر دەستێن خۆ يێن مەزن و ئەسمەر راكرين.. و ئەنيا وان ماچى كرى.. و نافێ خودێ ئينای و داخاز ژێ كرى ژ چاڤێن حەسيدا بپارێزيت.. وپرچا وان دتراشى ويارى وحەلاوە و جلك بۆ دكرين.. و هەلدگرين تا بازێرێ ياريان، و باخچێن گشتى وسينەما هاڤينى. و ل سەر دەستێ وى يەكەم جار بوو تام كريە كەبابێ ل سەر پرا كەڤن.. و خۆ ل سەر ملێن وى بلند دكرن دا پێلێن خۆنيشادانا حوسەينييە ببينن د كولانێن تاخێ "كازمييێ" يێن تەنگ دا، وب دەستێن خۆ ئێكەم پێلاڤ كريە پێن وان يێن بچويك.. وئێكەم قوردولا سپى كەزيێن وان يێن بچويك (ئەوين دسەمايەكا بەردەوام دا) پێ گرێددان.. و ئێكەم ديارىيا سەركەڤتنێ ل قوتابخانێ، وئێكەم ديارىيا دەواتا وان بۆ ئينا.. زاروكێن خێزانا مەزن.. كور و كچێن پسمام

و دوتمام و كورو كچێن خال و زاڤا و هەڤلنگ و كەسێن نێزیك و گەلەك دویر.. هەمیا گەلەك حەز ژ ڤی پیرەمێرێ بەژن كورت و ران و زەند بادای دكر.. ب دێمێ خوٚ یێ ئەسمەر ئەوێ بدەهان خیچێن قورمچی لسەر دیاركری و پەحنكا دەستێن وی یێن ب بەردەوامی زڤر و خوهدای وتێن شیر.. وبەریكێن وی یێن كویر وەكی عمبارەكا بێ دویماهی.. بوٚ دەرهەمان و نیمویان و گیزان و پرتێن حەلاوێ.. ئەو حەلاوا بێهنا وێ مروٚڤ بێ هوٚش دكر كو ل ڤان روٚژان نینە، ئەوا وەرپێچای دناڤ كاغەزەكا رەنگا و رەنگ و جوان دا.. كاغەزا وێ د برسقی بشێوەكی كو نوكە بەر چاڤ نا كەڤیت.

بەلێ كەس ژ ڤان كوروكچكێن خوشتڤی، ئەوێن ناڤ و وناڤێ نازداریێن وان ئێك ئێك دزانن.. ژ پشتا وی نەبوو، هەر وەكی هەمی دزانن وی چ جارا ژن نە هینابوو .. هەتا ئەڤ "ئەڤیا" وی، ئەڤا ل روٚژا ژدایكبوونا وێ ئەڤ ناڤێ سەرنج راكیش و كەڤن ل

سەر دانا، ئەوا زارۆكێن وێ ل بن پەنجەرێ یاریا دكەن، **كچا** كچا برایێ وی یە..

برایێ وی بەری چل سالان یێ بەرزە بووی.. شەڤگەرەكا پۆلیسان لسەر سنوری گرت بوو دەما ل بەر پەزێ خۆ ل رەخێ گوندێ وان یێ دویر و بچویك بوو ، پشتی هینگێ برە پایتەختی، بۆ "**قەسر النهایە**".. ئەو جهێ دەمێ ناڤێ وی تێتە گوتن زەلام ژبەر د لەرزن.. و ئەو كەسێ نە خویندەوار و خشیم و سادە كو ژ جل و بەرگێن وی بتنێ بێهنا گیای وپشكلێت پەزی زیدەتر چ بێهنا دی نە بوو، ب سیخوریێ و ڤەگوهاستنا پێزانینێن نافخۆیی بۆ دەولەتەكا بیانی هاتە تاوانباركرن! برایێ وی یێ مەزن بلەز چو گوندێ وان.. **كچا** برایێ خۆ دیت یا بتنێ د قولیچا كولكی ڤە ژ ترس و برسی و تایەكا گران د لەرزیت.. ئینا دگەل خۆ هەلگرت و برە پایتەختی، و سوزدا ب چاڤدیریێ و خودان كرنا وێ هەتا پیچ پیچە چێبووی و هشێن وێ هاتنە سەرێ وێ. پشتی ڤێ چەندێ چۆ ل برایێ

خو ب گەرپێت.. چ پرسیار یان واستە لدەڤ ڤی و یێ دی ول ڤێرێ وڤێرا هەنێ نە هێلا هەتا ئێك ژوان کەسێن هاتن و چووونا قەسرێ دکەت ب ترس گوتێ:

- پرسیارا برایێ خۆ نەکە، من بچاڤێن خۆ دیت.. دەمێ ئازاردای و پرسیار ژێ دکر.. هەڤکارێن وی کینە؟ و وی ب گوتنەکێ بتنێ بەرسڤ ددا:

- "عمو.. والله عربی ما یعرف"

و بێ دەنگ بوو.. و بێهنا وی راوەستیا.. د ناڤ بەتمنیەکا لەشکەری هاتە پێچان و ب بلۆکەکێ چیمەنتۆیی ڤە هاتە گرێدان و هاڤێتە د رووبارێدا...

ئەڤا وی گوه لێ بووی نە گۆتە کەسێ، کچکێ ژی (ژ ترسا) پرسیار ژێ نە کر.. بەلێ ژ وێ رۆژێ هەتا ئەڤرۆ خەملا وێ هەر جلکێن رەشن..

و پشتی دو سالان کچك دا پالەکێ گەنج و مێرخاس ژ کەس و کارێن خۆ ئەوێ (وەك یێن دی ژ دلوڤانیا پیرەمێری ڤەخاربوو.. و ئەڤ خانیێ رۆژ

هەلاتی یێ کەڤن بۆ وان کری.. وئەڤ دارا کنێریێ دحەوشا خانی یا فرەهـ دا چاند.. و کۆمەکا کوروکچان ژ هەر دوکا پەیدا بوون.. پشتی مەزن بووین ئێك ب دویف ئێکی ژ خانی وەغەر کرن و کەس نەما ژ بلی ڤێ نەڤیا بچویك و هەڤژینێ وێ ئەوێ گەشتیار و ئەڤ هەردوو زارۆکان.. ئەوێن دوماهیك ئویشیێ ب تامن!

دارا کنێریێ رۆژ بۆ رۆژێ مەزن بوو.. و ل ئێڤارییێن رۆژێن پێنج شەمبی دو شەمالك هەلدکرن و ترارەکێ زیڤی تژی ئاڤا گولان دکر وهندەك چەقێن دارا ریلێ دکرنە دکولکەکا بچویك دا دناڤ چەقێن دارا کنێریێ را و فاتیحە دخواند ودەمێ زارۆکان پرسیارا هەر دوو شەمالکان ژێ دکر هێدی بەرسڤ ددا:

- **"ئەڤ شەمالکە ژ بۆ روحا باپیرێ هەوە یە.. برایێ من یێ هەژار"**

ودەمــێ پرســيارا شــەمالكا دووێ ژێ دكــر.. بــێ دەنگ د بـوو ئـو روندكـەكا بچويك د چاڤێ وی دا د هەژيا هينگێ زارۆك ژ پرسياران رادوەستيان.

بـەلێ مـرۆڤێن مـەزن، ئـەو پيرەمێـرێن دگـەل دا دژيان نهێنيا شەمالكا دووێ دزانی: ئـەو يـا **(خـانم)**ێ خۆشـتڤيا ويـە.. دەزگـرا وی ئـەوا ژێ هاتيـە دويـر ئێخســتن ب دو رۆژان بــەری دەواتــا وان و بريــە شەڕی.. ل"**سەفەر بەر لەك**".. ژ بەری چەند سالان كە ناهێنە هژمارتن و دبێـژن هاتنـە ڤـە و زڤـرين ژ وێ رێكـێ نينـە... و هنـد ڤـەما هـەتا گـوتن ئـەو نازڤريت.. و كەس وكارێن وێ زوری لێ كر كو شوی ب بازرگانـەكێ گـەنم شاميان و تۆڤكـان يـێ گـەرۆك بكـەت.. ب زوری ل سـەر پشـتا هێسـترا خـۆ گرێـدا وهەتا نوكە كەس نزانيت كيڤە بر.

**_ ئاخ "خانم"ێ.. ئەی خودانـا چاڤێن بەلـەك و لێڤێن تەنك و دەڤێ بچويك كو هەردەم كەنيكەكا ب دەنگ و زەنك دشەرماندا ڤەشارت.. تە دزانی ئەز نە مريمــە.. و دێ ڤەگرێمەڤـە بـۆ گونـدی.. لـەوا تـە**

**کەزیێن خۆ ڤوساندن و کراسێ خۆ دڕاند هەتا مل و گەردەنا تە یێن وەکی پەمبیێ سپیێ ڤەهاندی دیار کرن.. و تە دو جار بزاڤ کر خۆ بکوژی.. و وەختی تو دویر کەفتی ئەڤە دوماهیك پەیڤ بوون کەس وکارێن ل تە گوه لێ بووین: دێ خۆ کوژم.. دێ خۆ کوژم.. بەری هیچ زەلامەکێ دی دەستێ خۆ بکەتە من!**

لێ وی چ جار ژن نە ئینا.. جارەکێ و دو جار هزرا ژن ئینانێ گوتنێ، بەلێ وی چو دەرفەت نەدان و ژ ڤێ بابەتی بێ هیڤی کرن.. گازندە و خەمێن خۆ بۆ کەسێ نە دگۆتن.. گازندە وقەهر و کینێن خۆ دیار بۆ کەسێ نەدکرن.. ئەو ژمرنێ ڤەگەڕیا بوو.. ژ وی شەڕی ئەوێ گەلەك بەحسێ نە دکر.. وی نە دڤیا بەحسێ کاودانێن شەڕی بکەت یان مێرخاسیا خۆ تێدا.. هەرچەندە دەمێ زڤری دو تبلێن وی ژێڤە ببوون و نیشانا برینەکا درێژ و کویر ل ریێ وی یێ راستێ بوو.. ڤێ نیشانێ ژ بلی مێرخاسیێ چ رامانێن دی نە بوون.. و ل دەه

شەڤێن دەستپێکا هەیڤا موحەرەمێ، دەمێ دەنگێ خەلکی گەلەك بلند د بوو یان گوهداریا رویدان و کاودانێن شەڕی دکر دا ژخەلکی دویرکەڤیت و بتنێ روینتە خوار.. ب جلکێن خۆ یێن رەش کو پتر جوانیێ لێ دیار دکر.. و دا کەتە گری.. کەلەگریەکا ب هژمەت و بێ دەنگ و هێدی د دانا سنگێ خۆ یێ پیر و زەبەللەح و مابەین مابەین هەر هەناسەکێ ئاخینکەکا کویر و ب حەسرەت هەر وەکی سیها مێلاکا وی شەق دکر:

-ئاخ ستەم لێکری!

.....

و پانك هێدی دزڤری هەر وەکی دڤێت سەحکەتە ڤی دێمێ ئەسمەر و ئەو خوها پێڤە بستریت ل ناڤ دێمێ ڤورمچی و هەناسا دوماهیێ یا بایەکێ خۆش هنارت و زڤری ب زڤرینەکا پر بۆرین تا خولا خۆ یا دویماهیکێ وهەتاهەتایی تەمام کر.. و هەناسێن پیرەمێری بێ هێز بوون.. بەلێ پا هەست ب بێهن

تەنگییٚ و بیٚزارییٚ نە کر.. و گاڤ بۆ گـاڤیٚ لیٚـدانا دلیٚ وی لاواز تـر لیٚ هات...

خـۆ دیـت ل سـەر ئاخـەکا تـەڕ و نـەرم وەکـی عـەوری... و ل بـەر سـنگیٚ وی، دنـاڤ تـەم و مـژەکا شـین، دەرگەهـەکیٚ زیڤیـیٚ بچویك دبرسقی هنـدەك چەقیٚن شینکاتییٚ ژ دارئالینکیٚ ب سەر دا هاتبوونـە خـوار.. و پـیٚش ڤـە چـوو هـەر وەکـی ل سـەر ئـاڤیٚ بریٚڤە دچیت.. ل بەرامبـەر راوەسـتیا بـەلیٚ دەرگـەه نە قوتا.. ب دەنگەکیٚ هیٚدی ئاخفت:

-دگ.. دگ.. دووگ!

لیٚ بەرسـڤ هـات ل پشـت دەرگـەهی.. بدەنگـەکیٚ کەهی ب تاما هنگڤینیٚ شانیٚن چیا:

_ کییە؟

پەرسڤ دا ب دەنگەکیٚ پر شکەستن تیٚدا:

_ ئەزم؟

_ چك چك!

و دەرگەه ڤەبوو.. سیلاڤەکا روناهیا سـەیر ژیٚ د باری ئـو وەلیٚکـر کـو دەسـتیٚ خـۆ ل بـەر چاڤیٚن خـۆ

بدانیت.. دەستێن وی ئەوێن نەدزانی کو یێن نەرم وسپی وەکی بەفرێ بووین.... و هێدی هێدی دەستێ خۆ ژ بەر چاڤێ خۆ راکر، ئینا دیت کچکەکا چاردە سالی، چاڤ بەلەکی خودێ قەت وقەت جوانتر نەداینە..

**_ ئەی خودایێ خودان شیان و سەرکەفتنێ! ئەڤە توی.. ل دوماهیێ! خا....!**

ژ لێڤێن وێ یێن وەکی رەنگێ گێلاسێ ئاوازەك لێ باری و گۆتێ:

**_ سەر چاڤا...**

و دەنگێ وێ هاتە گوهۆرین.. ویێ وەسا بوو تە نەدزانی یێ پر پێکەنینە یان یێ گریوکێ ڤەدشێریت...

**_ سەر چاڤا... کەرەم کەن..**

و بێهنا ئاڤا گولان و تیشکا روناهیێ هەمی تشت ب خۆڤە گرتن... !

باپیرێ وی گۆتێ:

کورۆ. پێن خۆ ژ لحێفا خۆ درێژتر نەکە!

ئەو گەلەگ یێ بچویك بوو.. رەنگە تەمەنێ وی هێژ نە بوویە شەش سال.. لەوا مەبەستا پیرەمێری تێنەگهەشت و کرە غار دا ب سەر گرێ دۆشەك وبالیڤك ولحێفان ئەوێ لسەر مێزێ کوم کرین بکەڤیت. ئەو مێزەکا داری یا کەڤن بوو کو بەشەکی مەزن ژ مەزەلێ گرت بوو. ل ڤێ مەزەلێ باب وباپیر وبرایێن مەزن وهەر دو مامێن وی روینشتی بوون ل دۆر سۆپا فستەقی ئەوا گورپیا وێ وەك ئەجنەکێ شین و ئەحەویای درەقسی.

زارۆك روینشتە خوارێ دا ل جاجمێ خۆ یێ خاکی بگەریت، ئینا لەشێ خۆ یێ بچویك درێژ کر وپێن خۆ داپوشین.. جاجم[1] کێشا پاشی ژڤراند و جارەکا دی کێشا وما حێبەتی.. وی نەدزانی کا چەوا

---

[1] جاجم (د زارێ فەیلی دا): جورەکێ ژ بەتانیێن خۆمالی یێن کو ژ هریێ دهێنە چێکرن.

فەرمانا باپیری بجه بینیت. کەنێن مەزنان بلند بوو، لـەوا وی گەلـەگ شـەرمکر ورابـوو تەحسـی وخـۆ ڤەشارت ل بن مێزێ (ئەوا تا ئەردی داپۆش کری ب چەرچەفەکا ئەسمەر) کو ئـەو هیببوو ل پشت وێ خۆ ڤەشارت دەما هنـدەك ئـارامی وسـەربخۆبووینیێ دڤیـا ل ڤـی خـانیی بچـویك یـێ کـو هـەر پـر ب ڤێرڤێری وقەلەبالغە.

وان ئاخڤتنا خۆ بەردەوام کر...

سـوحبەتا وان پشـتی بـەرنامێن دنگوباسـان دەسـتپێکر. و وێ ژکەڤنـدا (وەکـی هـەرۆ) ل سـەر حوکومەت و رویـدانێن رامیـاریێ بـوو: خـزم ونیـاس وهـەڤالێن زینـدان وسـێدارەکری، گرتیخانـە وهـۆلێن ئـازاردانێ یـێن پـر ب تـرس، گۆتـارێن سـەرۆکێ نـوی یـێن تامسـار وجهـێ پـێ کـەنینێ، قەدەغـەکرنا هاتوچوونێ، دویماهیکێن کودەتایان[1] ..هتد.. هتد..

---

[1] کودەتا: ئینقلاب، ئانکو گوهۆرینا حکومەتێ بشێوەیەکێ سەربازی.

زارۆکــی گەلــەك حــەز دکــر کــو دگــەل وان دا بروینیتە خوارێ دا گوهـ ل ڤان پەیڤێن مەزن و پڕ نهێنی ببت. دەما مامێ وی بێ جحێل دەستێ خۆ دانای سەر سەرێ وی و پرچا وی یا ڤژ پەرخاند وگۆتێ:

-ڤێجا سیاسەتڤانێ مە یێ بچویك..تە چ پلان هەنە؟

وی بلەز بەرسڤ دا:

-دێ کودەتایەکێ چێکەم!

کەنیێ ژ نوی بلند بوو. مامێ وی بێ کو پێترانا خۆ دیاربکەت جارەکا دی پرسیار ژێ کر:

-وەی بابۆ! ئێکسەر بۆ کودەتا؟ باشە سەرکردێ مە تە ئامادەکرنێن خۆ گەهاندیە بۆ کیش ئاستی؟

ئەو ب متمانە بەرسڤ دا:

ل دستپێکێ دێ "مەنتورات"[1] بەلاڤ کەم (ئەو نەدشیا پیتا "شین"ێ بێژیت) پاشی ب تەیارێن میگ هێرشێ کەمە سەربازگەهێن میری!

---

[1] منشورات ئانکو "بەلاڤوکێن" سیاسی.

سەحەت خوش! وهەکە کودەتایا تـە بسـەرکەڤت، دێ کێ سێدارەکەی؟

ئەرێ پێدڤییە ئەز خەلکی سێدارەبکەم؟

ئـەرێ‌ێ! پـا چـەوا؟ مـا دەم کودەتـا هەیـە سێدارەکرن ژی یا هەی!

کور ما حێبەتی. ناڤێن هەمی وەزیر وسیاسەتڤان وئەفسەرێن مەزن ئەوێن ب شەڤ وروژ بەرامبـەر وی خەبەر دگوتنێ ژ بیر کرن، وب تێکچوونیی ڤە وەلام دا:

- تو.. وباپیر.. وبابێ من!

کـەنیێ وان پـەقی! و بـابێ وی شـەقەك دانـا ناڤملێن وی:

هلـو.. خـودێ ژ تـە و کودەتایـا تـە وددانـا تـە یـا دەڤلو رازی نەبیت!

ومامێ وی قونجریکەك ل دفنا وی یا خوهدایی دا وگوتێ:

ئەرێ ئەڤە پلانێن تەنە سەکردێ قەواد!؟

لێ دەما باپیرێ دەڤێ خۆ ڤەکری هەمی مت بوون:

بێ سیاسەت و بێ حیزبایەتی وبێ گوێخوارن!
کوڕۆ پێن خۆ هندی لحێڤا خۆ درێژ کە!

***

دا جارەکا دی فێرببی کا چەوا پێن خۆ هندی لحێڤا خۆ درێژ بکەی!

دێمێ سەیدا "حەمێ بسەهمی"ی ژ تووڕەیێ سۆر بوو، و ڤێژی کرە هەڤالێ وی "رەشۆ" وجارەکا دی چویڤێ خۆ راکر:

دستێ خۆ پێ دی ڤەکە.. کوڕێ کەری! تو خۆ دکەیە فەیلەسۆف و هەڤرکیا من دکەی سەرا ڕاڤەکرنا پەرتوکا پیرۆز !؟

ئەو د تەختکێ خۆ دا نقۆبوو.. وهازێبوو کو چبکێن گەرم دەرپێ وی تەر دکر!

***

-کوڕێ من نەڤە زبۆ پەرژەوەندیا تەیە.. دا فێرببی چەوا پێن خۆ هندی لحێڤا خۆ درێژ کەی!

"عەریف سەلمان"ی گۆتێ ب شێوازەکێ ئاشتیخواز پشتی وی سزادای وفەرمان دا کو خۆ بقولپینیت ناڤ تەقنا سەربازگەهێ چونکی ئەو وێریا قەبخوازیا وی بکەت وفەرمانێن وی بجه نەئینیت.

***

- پێن خۆ هندی لحێفا خۆ درێژ کە. تو ژ چارەنڤیسێ دو هەڤالێن خۆ فێرنەبووی؟

رێڤەبەرێ گشتی جارەکا دی گەف لێ کر دا رێکێ نەدەتێ بەحسێ گەندەلیێ بکەت یان مایێ خۆ دنهێنێن ژمێریاریێ دا بکەت.

***

- پێن خۆ هندی لحێفا خۆ درێژ کە

- پێن خۆ هندی لحێفا خۆ درێژ کە

***

نهو دەما ئەو لسەر تەختێ نەخۆشیێ نڤستیە (و وەك هەمی پیرەمێران ئەوێن ژنشکەکێڤە بیرەوەریێن زۆر کەڤن دهێنە بەر چاڤێن وان) سوحبەتا کودەتایێ بیرکر.. و گرنژینەکا مەزن ل

سەروچاڤێن وی هەلات. ڤێجا گۆتە کچا خۆ ئەوا بشەڤ ورۆژ خودان دکر:

- سەحکێ کا پیێن من درێژ بووینە؟!

کچێ مەبەستا وی تێنەگهەشت لەوا پیرەمێری ڕۆهنکر:

-دبێژن دەما مرۆڤ ئەمرێ خودێ دکەت پیێن وی درێژ دبن!

کچێ دەستێ خۆ دانا سەر سەرێ بابێ خۆ وب دلەکی ترسایی گۆتێ:

-خودێ نەکەت باب.. عەمرێ من لسەر عەمرێ تە بیت!

-ڤێ لحێفا زنخ ڕاکە.. من لحێفەکا دی دڤێت.

-ئەرێ نە ب دلێ تەیە.. ئەڤە لحێفەکا نویە.. ما یا گرانە؟

-نە، نە. من دڤێت بەس بۆ من بگوهۆری.. گوه بدە من: لحێفا حەمۆ بۆمن بینە (ئەو کورێ کچا وی یێ شەش سالی بوو)

کـچ ماحێبـەتی، لێ نەچـار بـوو داخـازا وی بجـە بینیـت.. وبێهنـەکا دی هـەول ددا ڤـێ داپۆشا کـورت دگەل بەژنا وی یا درێـژ بگونجینیـت ودڤیـا پیچەکێ وێ بکێشـیت دا پـێن وی یـێن سـار ولاواز داپـۆش بکەت، لێ پیرەمێری ئەو نەهێلا وگازیکرێ:

-نە.. دەستێ خۆ ژێ بەردە! بـلا پـێن مـن دیـاربن (و وەکـی دگـەل خـۆ دئاخڤیـت) مـن دڤێـت جارەکـا بتنـێ پـێن خـۆ تـا دویمـاهیکێ درێـژ بکـەم.. جارەکـا بتنێ بەری ئەز بمرم (و بەرێ خـۆ داڤ وێ) حـەموێ بۆ من بهنێرە.. من دڤێت دگەل وی پاخڤم.

حـەمۆ ژی گەلـەگ ژ بـاپیرێ خـۆ یـێ خـەریب بـووی.. ئەڤـە چـەند رۆژە ژ دیتنـا وی یـێ قەدەغـە بوویە.. لەوا کرە غار وخۆ هاڤێتە سەر سینگێ وی:

-باپیرۆ ئەز حەز ژ تە دکەم.. ئەز گەلـەگ حـەز ژ تە دکەم!

-ئەز ژی حەز ژ تە دکەم شـەیتانۆ.. لێ هشیار بـە سـەی بـاب پەراسـیێن مـن نەشـکێنی! (وئـەنیا وی ماچی کر وباش بێهن کرە وی ودێمێ وی گەش بـوو)

گوهێ خۆ بدە من.. ئەرێ تو یێ رازی لحێڤا خۆ بدەیە من؟ ئەز دێ ڤەر کەم.. بۆ چەند رۆژان.. دبیت بۆ چەند دەمژمێران هەتا.. ها؟ تە چ گۆت؟ تو ڤایلی؟

-ئەرێ.. ئەرێ باپیرۆ. وەکە تە دڤێت دێ هەموو یارییێن خۆ ژی دەمەتە!

-دبیت هندەك ژ وانا ژی ڤەر بکەم، ئەگەر جارەکا دی رابووم، لێ من دڤێت تشتەکی بێژمە تە، تشتەکی زۆر گرنگ:

هشیار بە چ جار پیێن خۆ نە چەمینە، چ جار هیڤی نەکە ئەو پچویکتر بن ژ لحێڤا تە.. عەیب و ڤوسیری بەردەوامی نە ژ پیێن تە نە. گەلەك جاران ڤوسیری ژ لحێفێیە.. تێگەهەشتی شیمۆ.. و تشتەکێ دی: چ جار گوە نەدە ئاخفتنا دایبابێن خۆ دەما فەرمانێ ددەنە تە دا پێن خۆ هندی لحێڤا خۆ درێژ بکەی.. خۆ ئەگەر بێژنە تە دێ نەساخ بی یان دێ مری ژی! ئەو ترسنۆك وبێ جورعەتن، لێ تو شێری.. تو زەلامی.. ما نە؟

- ئـەرێ ئـەرێ بـاپیرۆ.. ئـەز "دەلامـم" .. ئـەز "قەهلەمانم" !

- سەحەت خۆش قەهرەمانۆ !

وقونجرپیکەك ل دفنا وی یا خوهدایی دا..

و ژ کویراتیا دلێ خۆ یێ ڕازی ومتمان گرنژی..

وچاڤێن خۆ نقاندن..

ئو هەست ب ئازادیێ کر..

و بۆ جارا ئێکی کەیفا وی هات.. ژ بایێ هوین ئەوێ پێن وی دشویشتن!

رۆژەکێ ژ رۆژان سێ جادوگەرێن دین کۆم بوون دا تشتەکێ نوی وسەیر بئافرینن.

یێ پیرتر کالە مێرەك یێ خودان هزار روی بوو. جارەکێ هشك، جارەکێ نەرم، جارەکێ رەق و جارەکێ یێ دلۆڤانە.. دێمێ وی هەر دقولپیت دناڤبەرا تاری وناڤچاڤگرییێ دا.. و شەوق ڤەدانەکێ کو چاڤێ دنێشێنیت.. وان دوو یێن دی گەلەك رێز لێ دگرت ونەدویریان دەما ئەو حازر بیت بدەنگەکی بلند باخڤن.

یا دووەمین ئافرەتەك بوو.. ئەرێ، ئافرەتەکا هەر گەنج وجوان یا دبایێ جحێلینیێ دا بوو، و کەسێ زهەژی خۆ نە ددیت.

د لەوحێ چارەنڤیسیێ دا یا نڤستی بوو کو ئێك ژ جادوگەرێن فەرەنسی (ئەوێن ل ژێرمالەکا تاری وبێهنتەنگەر خۆ ڤەشارتینە) دێ ڤی ناڤی دەتێ ئەوێ وەکی ڤێریا خۆشی یان داخباری دیتنا ڤێ کچێ کو هەکە ئەو نەبا نە هەبوون ونە ژیان هەبوو. دا ئەڤ ناڤە دگەل وێ بمینیت وناڤێ خۆ یێ

کەڤن ئەوێ ئێکمین دین د میژوویێ دا دایەڤ وێ..
ژبیر بکەت!

یێ سێیەمین جحێلەکێ سڤك و سەرگەرم ونەحەویای کو ژ دەستپێکا هەبوونێ حەز ژ وێ زەرێی دکر ولدویڤ دکەڤت و قەت ژ خۆنویساندن وغاردانا دگەل وێ ل بیابان وچیا ونەهال بێزار نەدبوو!

ڤێجا هەر سێ وەکی ژ کەڤندا کۆم بوون، وبریار دا کو تشتەکێ نوی چێبکەن.. دویر ژ چاڤێن خوداوەندان.

هەلبەت ئەو گەلەك جاران بەری نوکە روینشتینە خوارێ،یان هەر سێ بتنێ ویان دگەل مێهڤانێن نوی. د ڤان کۆمبوونان دا تشتێن سەیر وئەنتیکە چێدکرن: لەشێن زیندی وئاخفتنکەر، خوین، کاغەز، شیر، شمشیر، ئامیرێن مۆزیکێ، بەرێن رەنگاورەنگ، چەکێن ژنکان،پێنوس، سووتەمەنی، دارێن بلند و گیایێن کو نەشێن سەرێ خۆ ژ ئەردی

راكـەن... ئاهـا.. ئـەرد! كـا ئـەرد ب خـۆ چـيه بـێ هەبوونا وان؟

-ڤێجا بلا تشتەكێ نوی چێكەين.. و بـلا ديـاری كەين بۆ نفشێ مرۆڤان..

-بلا خۆشيێ ب دلێن غەمگين دانيت.

-و هيڤيێ بدەتە بێهيڤيان.

-و چەلەنگيێ بۆ دودلان.

-بلا ئەزمانێن گرتی ڤەكەت.

-بلا مرۆڤێن دلرەق پێ پر دلوڤان ببن.

-بلا مرۆڤی پال بدەت بۆ سەمايێ.

-و گری.

-و مەردينی.

-و مێرخاسی.

-و بلا ماسكان ژ رويێ وی را بكەت.

-و بەندان ژ هزرا وی.

ئـەو ل دۆر ئـاگرێ پـيرۆز روينشتن.. يـێ پـير دو پەراسی ژ سينگێ خۆ يێ ب رەنگێ رەژوی.

زەری گیرۆ و دودل بوو ولدویماهیکێ دەستێ خۆ دانا بن مەمکێ خۆ یێ نازك ونەرم و پەراسیەکی ئینا دەر.. ئێك پەراسی بتنێ.. لێ لاوێ ئازا وئەڤیندار گازی کر:

-بەرامبەر ئێك پەراسی ژ خانما من یا دلرەق دێ شەش پەراسی ژ سینگێ من یێ پر ب گورپیا ئەڤینێ پێشکێش کەم!

و هاڤێتە دمەنجەلا زێرین دا.. وئاگر بلند بوو...

پشتی چل رۆژا پیچەك ژ ڤێ شەرابا سحرکری ڤالا کرە پەرداغەکا خەملاندی ب وینێن سەیر..

و ل ئەردی دادان.. پەرداغ دانا بەر دەرگەهێ کوچکێ و دو جارا دەرگە قوتان وپاشی بەرەڤ ئاسمان وعەوران فرین.

پشتی دەمەکێ مرۆڤی دەرگەه ڤەکر وژبلی پەرداغی چ نەدیت. ڤێجا ئەو بۆ دەڤێ خۆ نزیك کر...و... ئەو رۆژ بوو رۆژەکا پیرۆز د مێژووی دا !

دو زەلامان سترانەك دگۆت.. ئان یا باشترە ئەم بێژین: زەلامەكی سترانەك دگۆت. چنكو هەڤاڵێ وی بتنێ پتبت دكر، وهندەك جاران ژی سەرێ خۆ دهەژاند ئان لێڤێن خۆ دلفلفاندن. ژبەر كو وی چ جاران پەیڤێن سترانێ ژبەر نە كر بوون، و ئەگر ئەم راستی باخڤین: خودانێ دەنگەكێ نە خۆش بوو ئو نە یێ شارەزا بوو دمەقام وشیوازێن سترانبێژیێ دا.

هەر دو نیڤ سەرخۆش بوون، هەر چەندە یێ یەكەم نزیكتری سەرخۆشیێ بوو.. ئەرێ.. بۆچی وەسا نابیت؟ هەرێكێ.. ئەڤە بوهارە! ئەڤە فیستڤالە! ئەڤە دەمێ زارۆك و ئەڤیندار و جلكێن شیم یێن كو جادان وباخچە وگۆرەبانان تژی دكرن!

هێـدی هێـدی خــەلك ل دەوروبــەرێن وان كـۆم بوون.

هێدی هێدی دونیا ما بێدەنگ.. ژبلی سترانێ، كو هەر بلند دبوو، وهەر دلێن خەلكی داگیر دكرن.. ودفراندن.. وبوراندنا وەختی ژ بیرا وان دبر.

ولـدوماهیكێ.. وەك هــەمی تشـتان.. سـتران ژی ڤەمری.. ستران ژی مت بوو.

لێ ئـەو، مەبەسـت: ئـەو عاشـق.. یـێ بـەردەوام د سترانا خۆ دا بوو.. هەرچەندە كەسی گولێنەبوو.. خـۆ ژ خـەلكی دویـر كـر.. ول دوڕ خـۆ دزڤـری.. ودرەقســـــی.. وەك دەرۆیـــــش وقەلەنــــدەران.. وژچاڤێن وی یـێن ژ دونیایـا مـە بـەرزەبوین.. دو جـوكێن زەلال ژ رۆنـدكان دهاتنـە خـوارێ لسـەر روێن وی هەتا حەفكا وی و سینگێ وی تەر دكر.. بەلێ زەلامێ دووێ یێ مژویل بوو: خـۆ دچەماند بـۆ بینــەران.. وسوپاسـیا وان دكــر بــۆ پێلــێن چەپلان.. وتەویكێن خەلكی!

ئـەز گەلـەك حـەز ژ سـەفەرێ دكـەم. لـەوا، وەك هوین دبینن، چ جارا من گوهلێدبیت كۆ نیاسـەك یـان هەڤالـەك ژ سـەفەرێ دزڤریـت زوی ب زوی رادبم ب مێهڤانكرنـــا وی و بارانكرنـــا وی ب شـێلكێن پرسـیاران ئـەوێن دونیـا و بۆرینـا سـالان ئـەز فێركـریم كـا چـەوا بشـێوەیەكێ موكـەم وب سەروبەر ئێك ئێك پێشوازی بكەم و پێـزانینێن زۆر گـرنگ و ب مفـا ژێ دەربێخـەم. مـن چ جـار دەڤێ خۆ یـێ مەنـدهۆش نـە دگـرت دەمـا گوهـ ل بەرسڤا وان ددا، وقەت نەدوەستیام ژ دوبارەكرنـا پرسیاران خۆ ئەگەر ببانە سەد جار.
لێ ئەگەر ئەو مێهڤان وەكی من پرپێژ بیت ئـەزێ گەلـەگ هشـیار وگوهـدار دبم، ودەڤـێ مـن هـەر ڤەكریتر ومەنـدهۆش تـر دبیت وقـەت چ تشت ژ وێ نـا دەركەڤیت..وەیـە ژ بلـی ئـاهێن خوشـییێ یێن بچویك!

من پتر ژ بیست ئەلبومێن مەزن وپر ب دیمەنێن گەشتگوزاریێ ژ حەفت کیشوەرێن جیهانێ هەنە، ژبلی دەه ئەتلەسێن جوگرافی یێن رەنگورەنگ. ودەما هندەك پارە بدەستێ من دکەڤتن من یەکسەر کومبیوتەرەکێ کەڤن یێ بقست کری ویەکم "سی دی" ئەوێ من ئینای بناڤێ "ئەتلەسا جیهانێ" بوو.

ئەزێ شارەزامە بناڤونیشانێن هەمی ئێستگەهێن رادیۆ وسەتەلایت ومالپەرێن ئەنتەرنێتێ. من هزاران پویلێن پۆستەیان کۆم کرن خۆ ژ وەلاتێن کەس کولێنەبویە.. ئەز دکارم ب سەرکەفتنێ گەنگەشێ بکم دگەل ئەوێن بۆ دەهان سالان ل ئنگلستانێ بوون سەرا ناڤێن تاخ وجادە ومۆزەخانە وهوڵ وپارك ودەزگەهێن لەندەنێ. هەروەسا دشێم بێژمە تە کیژ هێلا ترامواییێ یان میترۆ تە دگەهینیتە بورجا ئیفێل یان موزەخانا لوڤر ل پاریسێ (سەحکە چەوا ڤان دو پەیڤان وەك فەرەنسیان دئاخڤم!) یان یاریگەها

شتوتگارت ل ئەلمانیا.. ئەز دزانم نرخێ لەفێن هەمبەرگرێ ل دیترویتێ چەوایە.. وژمارا تەبەقێن نافاهیێ جڤاتا شارەوانیێ ل سان سیباستیان ب چەندێنە.. ومالا سەرۆك وەزیرێ لۆکسومبورگێ ل کیرێ یە!

ئەرێ.. سەفەر عشقا منە.. سەبرا من ودلبەرا من یا ئێکانەیە..

لەوا.. ئەز گەلەگ خەمگین بووم دەما ئەو گلاسێ شەربەتا تامسار لسەر پاسپۆرتا من ڕژیای. ئەو پاسپۆرتا دەلال یاکو هەمی گافا ل بن پالیفکا من دنڤیت!

راستە وێ شەربەتێ پاسپۆرتا من زۆر خەراب نەکر ژ بلی بەرگێ وێ یێ گرانبەها ئەوێ من ل باشترین بەرگەهێن بازێری چێکری، لێ وێ رویدانێ ئەز گەلەگ تۆرە کرم.. ئەخاسمە ئەز نەچار بووم خۆ بگرم هەتا چوارشەمبا بهێت..

دەما برایێ من دهێتە دڤ من دا سەرەدانا من

بکەت.. و جلکێت من بگهۆریت.. وژوورا من پاقـژ بکەت..

...

ئاخ! ل من ببورن!

ئەرێ من نەگۆتە وە کو ئەڤە چل سالە ئەز ل ڤێ ژورێ خۆجهم..

ئەرێ..ئەز چ جارا ژێ نەدەرکەڤتیمـە.. چـونکی.. چونکی..ئەز نکارم پـێن خـۆ بلڤلڤیـنم.. ئـەز یـێ فالەنجی مە.. ئەز ژ بچویکاتییێ شەلەلی مە!

چونكى ئەو دەستچەب بوو.. خوداوەندێن دى يێن "چيايێ ئولومپ"ى ب شيوەيەكێ جودا جودا سەرەدەرى پێ را دكرن،.وترانە بێ دكرن، وژ خۆ جودادكر..

خەم ل دلێ وى رۆژ بۆ رۆژێ هەر زێدە دبوون تا بوويە ئاريشەكا مەزن، لەوا بريار دا سەرەدانا نۆژدارەكێ دەروونيێ ب ئافودەنگ بكەت.. بەلێ خۆ بۆ وى نەدا نياسين.. ئەرێ.. ئەو كيش كۆرەڤامە ئەوێ بزۆر دكەڤيتە كلينكا نوشدارێ دەروونى دا بێژتێ:

-چەوانى دوختۆر.. ئەز فلان خوداوەندم، بسپۆرێ فلان تشتيمە!

و ژ بەر كو ئاخفتنا راست و ئاشكرا ژ ئێكەمين پێدڤيێن چارەسەركرنا دەروونى نە (ئەڤە ژى دا گرێيێن كوير وسەربۆرێن كەڤن ئەوێن د ئەهشياريێ دا ڤەوەرياى نە ديار دبن) چارەسەركرنا وى ڤەت

بسەرنەکەڤت. وکرێیێن وی هەر بزەحەمت تر کەت.

لەوا وی هزر کر.. وهزر کر.. و لدویماهیکێ بریـار دا تشتەکێ بئافراینیت کو شتی وی د بێکەسیێ دا.. و د ژێکجودابوونێ دا.. و ددویرکەڤتنا خەلکی دا...

لەوا هۆزانڤان ئافراندن!

## (1)

## پەلاتینك

پەلاتینکەکێ ل سەر دەستێ وی دادا. بۆ هندەك چرکان پەرێن خۆ رەجفاندن.. و.. مری!

هەما هۆسا .. مری.. بێ نەگەرێن بەرچاڤ..

-"ڕەنگە ئەو وەستیای بوو"

پیرەمێر دگەل خۆ دئاخفت..

-"ڕەنگە یێ پیر بوو.. و ڕەنگە ئەوی وەك من.. خەمەکا کویر ونەدیار هەبوو!"

## (2)

## خوزیكێن پیرەمێری

-"خوزی..."

كالـەمێری گوتـە نـەڤیێن خـۆ دەمـا چـاڤێن وی كەتنـە یـارییێن خـۆش ودلڤـەكر ئـەوێن ل پـاركێ بەربەلاڤ بوون.

-"خوزی ئەو بتنی ئیك یاریێ بۆ پیرەمێرێن وەك من چێكەن!"

-"و تە دڤیێ ئەو چەوا بێت باپیرە؟"

نەڤیێ وی یێ بچویك پرسیار كر

-"وەك دایكـەكێ.." پـابیری گـوتێ "وەك دایكـەكا مـەزن.. ئـەوا ژ تشـتەكێ نـەرم وحلـی ودلوڤـان چـێكریە.. بـلا وەك دایكـەكێ كـو لسـەر ئـەردی روینشتیە خوارێ وهەر دو دەستێن خۆ ل سەر ئیـك ودو داناینە سەر سینكێ خۆ.."

-"و تو چ لێ كەی؟"

ئەڤێ وی یێ مەزنی ژی پرسیار کر

-"دێ خۆ ل هەمبێزا وی درێژ کەم.. دا ئەو من بهەژینیت.. بهەژینیت .. دهەژینیت.."

و دو دلوپێن رۆندکێ کو دچاڤێن وی دا ئاسێ بووین... مالین!

## (3)
## گۆپالْ

تایەکێ راست ودرێژ  ژ دارا هشك ومری قەتاند ورووینشتەخوارێ د دوکانا خۆ دا وی بتراشیت و گۆبالەکی بۆ خۆ ژێ چێکەت دا ب هاریکاریا وی بریڤە بچیت..

-"رەنگێ وی وەسا دلگر وپر پۆسیدەیە.. بلا ب رەنگی سۆر بویاخێ بکەم"

بێهنەکا دی بۆچۆنا خۆ گوهارت ودەست کرە بویاخکرنا وی ب رەنگێ سپی.. لێ ئەو دودل ما وجارەکا دی هزرکر ولدویماهیکێ ب پشتراستی گۆت:

-"نە خێر.. دێ ب کەسکی بویاخێ کەم.. بەلێ.. کەسك بتنی یا گونجاویە"

وهێدی دەسپێکر.. و ژ دلێ تایێ هشك ومری.. دەنگێ کەسەر وحەسرەتێن نزم دهات..

## (4)

## خەلك

ژ مـالا خـۆ دەركـەفت وچـوو سـەرێ جـادێ.. لوێدەرێ برەكا خەلكی دیت كو پڕ ب كۆڤان و ڤیری وگری و دهۆلێن تازیێ وبسەر وسینگ لێدان بوو.. ڤێجا ب پینگاڤێن گران بۆ مالا خۆ زڤری..

جارەكا دی دەركـەفت ودیـت كـو جـەماوەرێ ب شـەرەكێ دژوار مـژویل بـووین وب دەسـت وگۆپـال وخەنجـەران ب نـاڤ ئێـك كـەفتین.. ڤـێ جـارێ ب رویەكێ زەر بۆ مالا خۆ زڤری.

ل جارا سێێ كومـەكا خـەلكی دیـت كـو ب تـەڤر ومـەربێلان هێـرش ل داروگولێن وی باخچێ گشتی یـێ بچویك دكـر.. رابوو سـەرێ خـۆ هەژانـد وگـۆت "هـەما هنـدە" و ب نـاوڕێن خـەمگین ولەشـەكێ ب تایەكا گەرم زڤری.. دەركـێ ژناڤـدا ڤفلكر.. ومتمتـی كر:

-"سەیرە.. كا خەلك كیڤە چوون؟!"

## (5)

## گیان ژێکر

بەری عیزرائیل روحا وی ببەت پێنج خولەك دانە وی.. ئەوێ بلەز غاردا بەرەف گەنجینا خۆ یا ئاسنی ئەوا پر ب پارە بوو. ب دەستەکێ لەرزی ئەو ڤەکر.. بارێن دولار ودیناران ژێ ڤەزەلیان وکەتنە سەر ئەردی.. روینشتە خوارێ ورابوو ب هژمارتنا وان.. بلەز.. بلەز.. وەك خەونەکا دین وهار:

-"هزار.. دو هزار.. نوٚت هزار.. پێنج سەد وحەفتێ هزار.. سێ ملیوٚن.. حەفت ونیڤ.. هەشتێ ملیون.. چوارسەد وبیست ودو ملیوٚن وسێ سەد ودوازادە و....."

## (6)
## ل خانیەکێ دی

گیان ژێکر جارەکا دی بو هەمان کۆلانێ زڤری ڤــە.. لێ بــۆ خانیــەکێ دی.. زەلامــێ پشــتخوار روینیشتی بوو سەحدکرە وێنێن کەڤن دەما جحێل وگەنج .. دەما دەستێن وی دناڤ دەستێن دلبەرا وی دا .. (هەڤژینا وی ئەوا بەری بیست سالان وەغەر کری)

گیان ژێکر گۆتێ:

-"تە پێنج خولەك هەنە"

ئەو ب ئارامیێ رابوو سەر پێن خۆ.. پرچا خۆ یا سپی شەکر.. مەقەسەك ژ سەر میزێ هەلگرت ودەرکەفت بۆ باخچێ مالێ.. گولەگا سپی ژێگرت وکر.. ودەست ب ژیکرنا سترێێن وی کر و ب دەڤەکێ بکەنی ئاخفت:

-"ئەز هاتم.. ئەز هاتم دلبەرا من.. ئەز ها....."



برایێ وی بەری چل سالان یێ بەرزە بووی.. شەڤگەرەکا پۆلیسان لسەر سنوری گرت بوو دەما ل بەر پەزێ خۆ ل رەخێ گوندێ وان یێ دویر و بچویک بوو، پشتی هینگێ برە پایتەختی، بۆ قەسر النهایە .. ئەو جهێ دەمێ ناڤێ وی تێتە گوتن زەلام ژبەر د لەرزن.. و ئەو کەسێ نە خویندەوار و خشیم و سادە کو ژ جل و بەرگێن وی بتنێ بێهنا گیای وپشکلێت پەزی زیدەتر چ بێهنا دی نە بوو، ب سیخوریێ و ڤەگوهاستنا پێزانینێن نافخۆیی بۆ دەولەتەکا بیانی هاتە تاوانبارکرن! برایێ وی یێ مەزن بلەز چو گوندێ وان.. کچا برایێ خۆ دیت یا بتنێ د قولیچا کولکی ڤە ژ ترس و برسی و تایەکا گران د لەرزیت.. ئینا دگەل خۆ هەلگرت و برە پایتەختی، و سوزدا ب چاڤدیریێ و خودان کرنا وێ هەتا پیچ پیچە چێبووی و هشێن وێ هاتنە سەرێ وێ. پشتی ڤێ چەندێ چۆل برایێ خوب گەریێت.